Eng.Halmat Gharib Kh. 2008

DeskTop

# بەرنامەی

# Auto CAD
# Land Development




ئەندازیار
هەڵەت غریب خضر
2008

Eng.Halmat Gharib Kh. 2008

## بسم الله الرحمن الرحيم

## الحمدلله الرب العالمين والصلاة والسلام على اشرف الانبياء والمرسلين محمد صلى الله عليه وسلم وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين
## وبعد:

كارەكانی رووپێوی‌و ڕێگاوبان بریتیە لە کارە شارستانیە گرنگەکانی زۆر بلاوبوو لە هەموو جیهاندا.. چونکە کارەکانی رووپێوی کرۆکی سەرەکی هەموو کارێکی شارستانیە ...جا چ کارەکە بریتی بێت لە دروستکردنی بالەخانەکان یان شەبەکەیەکی ڕێگاوبان یان دروستکردنی بەنداوێك .....هتد.

بۆیە لەبەر پێویستیەکی گرنگ بە زۆر داواکردنی دقە لە کارە رووپێویەکان ... بۆ زیاتر دەربرینی ناچورال گراوندو پێچ و بەرزو نزمیەکەی...پێویست بوو کە مەسحێکی تەفصیلی تەواو هەبێت بۆ تەواوی ناوچەکە.

هەموو ئەمانە وایان کرد کە چەندین بەرنامە بێتە کایەوە بۆ یارمەتی دانی ئەندازیاری پسپۆر لەو جۆرە کارانە کە کارەکانی زووتر بە خێرا ئەنجامیان بدات, لە دروستکردنی هێلکاری و پلانەکان ....یەك لەو بەرنامانەی پەیدا بوون بەرنامەی Auto CAD Land Development کە لەلایەن کۆمپانیای Autodesk ی ئەمریکیەوە هاتە کایەوە ....

بۆیە بەرنامەی Auto CAD Land Development یەکێکە لە بەرنامە پێشکەوتووەکانی بواری رووپێوی‌و ڕێگاوبان... لەبەر بوونی چەندین فەرمان بۆ ئاسان کردنی کارەکان.

بەرنامەی Auto CAD Land Development خۆی ڕێك دەخات لە شێوەی ئەنجامدانی پرۆژە ... واتە پرۆژەك لە چەند فۆلدەرێك پێك دێت ...هەر فۆلدەرەو لەچەندین فایل پێك هاتووە وەکو فایلەکانی رەسم کردن و داتابەیس و راپۆرتەکانی تایبەت بە دەرهێنانی رووبەرو سایز......هتد

یەکێك لە ئاسانکاریەکانی بەرنامەکە ئەوەیە دەتوانین لە بەرنامەکەوە فایلەکان استیرادو ئێکسپۆرت (تصدیر) بکەین بۆ ناو بەرنامەکانی وەکو (ئەکسل و ئەکسس و ئۆراکل ....), یان دەتوانرێت یەکسەر لە ئامێری (Total Station) داتاکان دابەزێنرێت بۆ ناو لاند.

بەرنامەی لاند چەندین بەشە بەرنامەی وەکو بەرنامەکانی Auto CAD Civil Design و Auto CAD Survey و Map لە خۆوە دەگرێت بۆ تەصمیم کردن و شی‌کردنەوە.

لە هەموو بوارەکانی تر وەکو ( تەصمیم کردنی هۆریزۆنتەل کێرڤ و دەرهێنانی برەکانی خۆلکاری (برین و پرکردنەوە) و حسابکردن و وێنەکردنی کرۆس سێکشن و پرۆفایل.

لەکۆتایدا داوا لە خوای گەورە دەکەم کە سەرکەوتوومی کردبێت لەم کارەم .... پێشکەش بێت بە پەرتوکخانەی کوردیەوە وەکو تاکە سەرچاوەیەك تا ئێستا لەو رووەوە هەبێت کە چینی ئەندازیارو رووپێوان و قوتابیانی هەردوو چین سوودی لێ وەردەگرن.

(سبحانك لا علم لنا إلا ما علمتنا إنك أنت العليم ا كيم)

وسبحان ربك رب العزة عما يصفون, وسلام على ا رسل وا مد رب العا وصلى ا على رسوله مد, وعلى آله وأصحابه وازواجه وامته ا يوم الدين.

## پسپۆری:

بەرنامەکە گرنگی بە پسپۆری ئەندازیاری شارستانی دەدات

## سوود وەرگرەکان:

ئەنـدازیاری شارسـتانی دیزاینـەرو جێبەجێکـەر, هـەروەها دەرچـوانی پـەیمانگا تەکنیکیەکان و قوتابیـەکانی ئەنـدازیاری شارسـتانی و پـەیمانگای تـەکنیکی بەشـی رووپێو و رێگاوبان.

## پێناسەکردن:

بەرنامەیەکە کار لەگەل زانیاری رووپێوی دەکات, لـەوێوە دەسـت پێـدەکات بـۆ گەیشتن بە دیزاین کردنی رێگاوبان بەپێی مواصەفات و کۆدەکانی جیهانی بەهەمو تەفاصیلیەوە, بگرە لە پلانەوە (المسقط الافقي (Plan)) تا گەیشتن بە مەساری پرۆفایل (المسار الرأسي) (Profile), کۆتـایی هێنـانیش بـە کـرۆس سێکشـن مقـاطع عرضـية ( Cross Section) کـە تیایـدا سـلۆپی تەنیشـتەکان و شـۆلدەرەکان ( Widening )و بـەرزی پشـت لـە سـك ( Super elevation)و چەنالەکانی ساقیەکان القنوات التصريفية الجانبية ( Ditch )و دەرهێنانی بری برین و پرکردنەوە الكميات للقطع والردم (Cut & Fill) .

## بۆ فێربوونی ئەم بەرنامەیە پێویست دەکات:-

- زانیاریت هەبێت لەسەر سیستەمەکانی Win 98 , Win2000,Win XP یان هەر سیستەمێکی تر بێت.
- دەبێت زانیاری هەبێت دەربارەی بەرنامەی ئەکسل ( Excel ) و ........ بەرنامەی ئۆتۆکاد.
- کار کردن لەگەل هەر بەرنامەیەکی نووسین وەك MS Word , Not pad.
- زانیاری هەبێت لەسەر هاوکێشەکان (المعادلات) و تەصمیم کردنی رێگاوبان.

# هەنگاوە سەرەکیەکانی فێربوونی بەرنامەکە

## هەنگاوی یەکەم بەرنامەی

## (Auto Disk Land Development)

---




پێك هاتووە لە ........

- پێشەکی گشتی لەسەر بەرنامەکە.
- دروست کردنی پرۆژەو چۆنیەتی کـارکردن لەگەل پرۆژە کۆنەکان.
- ڕێگـای هێنـانی خالـەکانی بەرزکردنـەوەی ڕوووپێوی دەستکاری کردنیان.
- دروســتکردنی سەرفەیســێك کــە ناچــورال گراوند بنوێنێت.
- دروســـتکردنی هێلکـــاری کـــانتۆری بەراوردکردنی لەگـەل وێنـەی جیودیسـی و ئاسمانی.



## هەنگاوی دووەم: دروستكردنی پلان ..... المسار الأفقي ( Plan )

پێك هاتووە لە ......

- پێناسەكردنی بەرنامەكە بە زیاتر لە پلانێك.
- خالەكانی یەكتربرین (PI) لەگەل بەرین كردنی تەنیشەكان.
- پێكەوەلكاندن لەكاتی دەستكاریكردن لەسەر كار( Connection ).
- تەصمیم كردنی هۆریزۆنتۆل كێرڤ بەپێی خێرایی دیاریكراو.

## هەنگاوی سێیەم: بەرنامەی (Civil Design)

---




پێك هاتووە لە:

- رەسم كردنی پرۆفایلی ناچورال گراوند ( Existing profile ).
- دیزاین كردنی پرۆفایلی كۆتایی ( Final profile ).
- دۆزینەوەی درێژی ڤێرتیكەل كێرڤ.
- دەرهێنانی فایلەكان...راپۆرت.

## هەنگاوی چوارەم: كرۆس سێكشن

پێك هاتووە لە .....

- رەسم كردنی كرۆس سێكشن بۆ ناچورال گراوند.
- رەسم كردنی كرۆس سێكشن بۆ دیزاین پرۆفایل.
- رەسم كردنی هەریەك لە Super elevation و Widening و Ditch و Bench .
- دەرهێنانی زانیاری كرۆس سێكشن بەشێوەی فایل.
- دەرهێنانی بری كارەكانی برین و پركردنەوە.
- دەرهێنانی بری ئەسفەلت و لایەرەكانی ئەساسی و ژێرەوەی.
- دەرهێنانی بری كارە جێبەجێكراوەكان بەهۆی دوو سەرفەیس.

## هەنگاوی پێنجەم: Sheet Manger

پێك هاتووە لە .....

- دەرهێنانی رەسمەکانی پلان و پرۆفایل بە سکەیلی دیاری کراو.
- دەرهێنانی کرۆس سێکشنەکان بەهەموو زانیاریەکانیەوە.
- تەسلیم کردنی کۆتایی پرۆژەکە..

# وانەی یەکەم

## دروست کردنی پرۆژەیەکی نوێ




دوای کردنەوەی بەرنامەکە لە شۆرت کەت لەسەر دیسك تۆب یان لە ستارت ← پرۆگرام.

١-لە لیستی File→New دابگرە.

٢-ئەم پەنجەرەیە دەکرێتەوە... یەك بەدوای یەك زانیاریەکانی پردەکەینەوە بەم شێوەیە:

– لەBrowse ی بەردەم فەرمانی project path بۆ دیاری کردنی شوێنی پرۆژەکەمان لەناو کۆمپیوتەر (لە کۆمپیوتەری خۆم بەرنامەی لاند لە پارچەی D خەزن کردووە).

٣-Create Project... دابگرە لەپەنجەرەی بۆ دەکرێتەوە (Meter) هەلبژێرە, ئینجا ناو بۆ پرۆژەکە دابنێ لەبەردەم Name بنووسە بۆ نمونە با Eng.Halmat بێت. ئینجا OK دابگرە.




٤-لە Drawing Name ناوی فایلی رسم دەنوسین بۆنمونە Plan بێت.

ئاگادار بە: بە شێوەیەکی ئۆتۆماتیکی لەبەرامبەر فەرمانی Drawing Path ئەمە دەبینیت

**D /Eng.Halmat /dwg /plan**

ئینجا Ok دابگرە




٥-ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە Point Descreption Field Size دەتوانیت لەنێوان ٢←٢٥٤ (پیت) – حرف)بنوسیت بەلاَم ئێمە وەکو خۆی جێی دەهێلین واتە دەتوانین بە ٣٢ پیت وەسفێك بنووسین بۆ خالەکان.

Use Point Name

بەداگرتنی ئەم فەرمانە دەتوانیت ناو بدەینە خاڵەکان جگە لە ناوی ژمارەیی (تعریف رقمی)... ئەمەش لە حاڵەتێك دەبێت کە پێویستت بە زیاتر تعریف کردنی خاڵەکان بێت جگە لە ژمارە ناوییشیان بۆ دادەنێین

Point Name Field Size




ئەمەش هەروەکو سەرەوە ژمارەیەك دەنوسین بۆ ئەوەی بتوانین ناو بدەینە خاڵەکان بەلاَم ژمارەی پیتەکانی نابێت لەم ژمارەیە ڕەت بکات.

ئینجا OK دابگرە.

٦- ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە کە Meter بۆ وەحدەی ڕەسمەکە Degrees بۆ زاویەکان و Bearing بۆ چۆنیەتی نیشاندانی زاویەکان و دەقەکان بەم شێوەیە دیاری دەکەین:

**Linear 2**
**Elevation 2**
**Coordinate 2**
**Angular 4**

ینجا Next دابگرە.




٧- پەنجەرەیەکی تر دەکرێتەوە کە تیایدا قیاسی ڕەسمەکە دیاری دەکەین لە Horizontal وەبۆ ١:١٠٠٠ Vertical وە ١:١٠٠ بۆ حەجمی وەرەقەکە یان ٢١٠×٢٩٧ وەیان ٢٩٧×٤٢٠ بۆ نمونە ئێمە A3 دیاری دەکەین کە قیاسی یەکەمە. ئینجا Next دابگرە.

تێبینی: لەکاتی دیاری کردنی سکێلێك بۆ Horizontal بۆ نمونە ١:٥٠٠٠ گونجاو بو بۆ ڕەسم کردن, ئەوا سکێلێکی کەمتر بە دابەش ١٠ بۆ Vertical دیاری دەکەین, کەواتە ١:٥٠٠ دەبێت, چونکە خۆتان دەزانن فەرقێکی وا زۆر نیە لە بۆنواندنی فەرقی مەنسوب بۆ وێنەکردن.

دوبارە Next دابگرە.




٨- جۆری خەتی milli.stp بە سایزی ٥ملم دیاری بکە. ئینجا Next دابگرە.

٩- پەنجەرەیەکی تر دەکرێتەوە تیایدا جۆرێك لە چوارچێوە هەڵدەبژێریت یان وەکو خۆی جێدەهێڵیت. دواى Finish دابگرە.



پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە کە هەموو زانیارەکانی هەنگاوەکانی پێشەوت بۆ دەنووسێت....ئینجا OK دابگرە.

بەمەش فایلێکت دروست کرد وەك دەست پێکردنێك بۆ پرۆژەکەت.




## چۆنیەتی کردنەوەی پرۆژەیەك کە پێشتر دروست کراوە:

١-کلیك لەسەر Open بکە پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە

لە Browse دەچیتە ئەو دایرێکتەرەی کە پرۆژەکەت تیادا خەزن کردووە ئینجا تحدیدی دەکەیت و Open دابگرە.



# وانەی دووەم

## ڕێگای Space Delimited بۆ داخل کردنی خاڵەکان (نقاط) بۆ ناو بەرنامەکە

| | A | B | C | D | E |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1.00 | 890.26 | 1013.56 | 94.54 | H |
| 2 | 2.00 | 887.87 | 1008.31 | 94.68 | H |
| 3 | 3.00 | 892.32 | 1019.02 | 94.40 | H |
| 4 | 4.00 | 884.15 | 999.90 | 94.98 | H |
| 5 | 5.00 | 894.54 | 1023.57 | 94.27 | H |
| 6 | 6.00 | 879.79 | 989.08 | 95.29 | H |
| 7 | 7.00 | 882.11 | 988.37 | 95.29 | AS |
| 8 | 8.00 | 877.17 | 991.06 | 95.22 | AS |
| 9 | 9.00 | 897.26 | 1022.40 | 94.22 | AS |
| 10 | 10.00 | 882.02 | 1001.72 | 94.95 | AS |
| 11 | 11.00 | 884.62 | 1000.84 | 94.94 | AS |
| 12 | 12.00 | 887.16 | 999.75 | 94.89 | AS |
| 13 | 13.00 | 892.45 | 1025.44 | 94.27 | AS |
| 14 | 14.00 | 891.33 | 1008.79 | 94.57 | AS |
| 15 | 15.00 | 886.11 | 1010.86 | 94.65 | AS |
| 16 | 16.00 | 889.22 | 1017.85 | 94.46 | AS |
| 17 | 17.00 | 891.98 | 1016.86 | 94.44 | AS |
| 18 | 18.00 | 894.42 | 1016.12 | 94.41 | AS |
| 19 | 19.00 | 910.32 | 995.49 | 94.41 | W |
| 20 | 20.00 | 911.45 | 997.88 | 94.37 | W |
| 21 | 21.00 | 907.99 | 991.09 | 94.54 | W |
| 22 | 22.00 | 905.16 | 984.72 | 95.01 | W |

چەند جۆرە ترتیبێك (شێوەیەك) هەیە بۆ دروست کردنی فایلەکانی خاڵەکان دوای ئەوەی کاری ڕووپێوی تەواو دەبێت و خاڵەکان لەبەرنامەکان NotePad یان Excel یان Access یان Vesual Basic ...بەرنامەی تر, ئامادەی دەکەین.

بۆ نمونە:

**NO E N ELE. DESC**

**Nomber East North Elevation Description**

ڕەقەمی خاڵەکە ڕۆژهەلات باکوور بەرزی وەصفی خاڵەکە

ئەگەر لە Excel خاڵەکانمان داخل کردبوو وە بەم تسلسلەی کە لەسەرەوە باسمان کردبوو,

١-دەچین لە Excel فایلەکە دەکەینەوە ئینجا فایلەکە Save as دەکینەوە بەلام ئەم جارە ئێکستێنشن **(Tab delimited) Text** هەلدەبژێرین ئینجا Save دەکەین لەناو فۆلدەری Point کە خۆمان دروستی دەکەین لە ناو دایرێکتی D:\Land Projects 2007\Eng.Halmat\in\points




ئەو ئێکستێنشنانەی لە لاند وەردەگیرێن بریتین لەمانە:

.txt فایلی نوسین جیاکراوەبێت بە بۆشایی

.CSV فایلی ئەکسل جیاکراوەبێت بە فاصلە.

.prn فایلی نوسین جاکراوەبێت بە بۆشایی.

.xyz کۆردینەیتی ئیکس وای زێد.

.auf جیاکراوەبێت بە بۆشایی (autodek uploadable).

.nez کۆردینەیتی جوگرافی (ڕۆژهەلات, باکور, بەرزی).

٢-ئینجا لەبەرنامەی لاند دیسکتۆپ خاڵەکان داوا دەکەین بەم شێوەیە:




**Points → Import/Export Point → Import Points**

لەبەردەم فەرمانی Format ئەمە هەلبژێرە:

**PENZD (space delimited )**

وە لە Source File کلیك لەسەر ئایکۆنی Open بکەو ئینجا برۆ

Projects D:\Land 2007\Eng.Halmat\in\points




فایلەکەت هەلبژێرە کە لـە هـەنگاوی سـەرەوە دروسـتت کردبـوو ئینجـا OK دوبـارە OK دابگـرە, بەمـەش هـەموو خالـەکان دەگواسترێنەوە بۆ ناو بەرنامەکە.

ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەکرێتەوە

## What to do if the point numbers are supplied by the source:




واتە چیت ئـەویت بیکـەت ئەگـەر ئەوخالانـەی کـە تـازە Import کـرد تـرقیم کرابـوون بـە (رقـم للنقطـة) لـە مصـدەرەوە واتـە پێشـتر خالـەکانت لـە Excel تـرقیم کردوون:

Use واتە هەروەکو خۆی چـۆن تـرقیم کـراوە هـەر ئـەوە بەکاربهێنەوە.

Ignore واتە ترقیمی خۆی اهمال بکـەو ئینجـا کـە ئـەم خیارەت هەلبژارد ئەوا

Add an offset ژمارەیەك داخل دەکەیت بۆ ئەوەی زیادی بکاتە سەر رەقەمی خالەکان لە فایلی مصدر.

بـۆ نموونـە: ئەگـەر نوسـیت ١٠٠ ئـەوا ئەگـەر فایلـەکان لـە مصـدەرەوە ١,٢,٣...... بێـت ئـەوا بـەم شـێوەیەی لێـدێت ١٠١,١٠٢,١٠٣.....هتد.

## What to do when point numbers need to be assigned to the points:

واتە چیت ئەوێت بکەیت ئەگەر خالەکان لە فایلی Import ترقیم نەکرابن, واتە ئەگەر پێویستی بە تعریفی رقمی بێت:

Use next point number بەکارهێنانی رەقەمی دوا خال بۆ ترقیم کردنی خالی نوێ.

Sequence from بۆ ترقیم کردن بەو رەقەمەی کە داخلی دەکەیت:

بۆ نمونە: ئەگەر ٢٠٠ پێدا ئەوا خالەکان بەم شێوەیە دەبن ٢٠٠,٢٠١,٢٠٢,٢٠٣ ...... هتد.

## What to do when the point number already exists in the point database:

چیت ئەوێت بکەیت ئەگەر هەمان رەقەم هەبوون پێشتر لە داتابەیسی لاند دیسکتۆپ:

Renumber واتە ترقیمی بکە بە حالـەتێك لە حالـەتەکانی سەرەوە.

Merge واتە خالی نوێ دمج بکە لـەگەل خالـەکانی پێشتر داخل کراو.

Overwrite خالی نوێ کە هەمان ترقیمی هەبێت لـەگەل خالی کۆن بیخە سەریوە

نموونە:

ئەگەر ئەم خاڵە لە داتابەیسەکەوە هەبێت

Number: 20
Northing: 350
Easting: 350
Elevation. 60.3
Descreption: IP

لەکاتی Import کردنی خاڵی نوێ ئەم خاڵە هەبوو:

Number: 20
Northing: 353.2
Easting: 348.45

ئەگەر Overwrite هەڵبژێریت ئەوا خاڵەکە لە داتابەیسەکە بەم شێوەیە دەمێنێتەوە:

Number: 20
Northing: 353.2
Easting: 348.45
Elevation. (Blank field)
Descreption: (Blank field)

بەڵام ئەگەر Merge هەڵبژێرین ئەوا بەم شێوەیە ئەمێنێتەوە:

Number: 20
Northing: 353.2
Easting: 348.45
Elevation. 60.3
Descreption: IP




| Number | Northing | Easting | Elevation | Raw Desc | Full De |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1022.103 | 910.119 | 0.000 | TR | TR |
| 2 | 1023.988 | 918.010 | 0.000 | EST | EST |
| 3 | 1020.141 | 917.226 | 0.000 | EST | EST |
| 4 | 1013.560 | 890.260 | 94.540 | 4-162 | 4-162 |
| 5 | 1008.310 | 887.870 | 94.680 | 4-163 | 4-163 |
| 6 | 1019.020 | 892.320 | 94.400 | 4-164 | 4-164 |
| 7 | 999.900 | 884.150 | 94.980 | 4-165 | 4-165 |
| 8 | 1023.570 | 894.540 | 94.270 | 4-166 | 4-166 |
| 9 | 989.080 | 879.790 | 95.290 | 4-167 | 4-167 |
| 10 | 988.370 | 882.110 | 95.290 | EST | EST |
| 11 | 991.060 | 877.170 | 95.220 | EST | EST |
| 12 | 1022.400 | 897.260 | 94.220 | EST | EST |
| 13 | 1001.720 | 882.020 | 94.950 | EST | EST |
| 14 | 1000.840 | 884.620 | 94.940 | EST | EST |
| 15 | 999.750 | 887.160 | 94.890 | EST | EST |
| 16 | 1025.440 | 892.450 | 94.270 | EST | EST |
| 17 | 1008.790 | 891.330 | 94.570 | EST | EST |

دوای هێنانی خاڵەکان بۆ ناوبەرنامەکە .....

دەتوانین کاری رەش کردنەوەو دەستکاری کردن.... دروست کردنی گـروپ بۆ خاڵەکان ئەنجام بدەین بەهۆی فەرمانی :

Points → List Point

بۆ پیشان دانی هەموو خاڵەکان لە داتابەیسەوە فەرمانی List All Point

بۆ ریزکردنی خاڵەکان بەشێوەی تصاعدی یان تنازلی کلیك لەسەر کۆڵۆمی Number بکە




بۆ ریزكردنی خاڵەكان بەپێی كۆردینەیتی باكوور بەشێوەی تصاعدی یان تنازلی كلیك لەسەر كۆلۆمی Northing.

بۆ سێ كۆلۆمەكانی تریش بەهەمان شێوەیە. تەنها كلیك لەسەر عنوانی كۆلۆمەكە دەكەین خۆی تصاعدی بۆ تنازلی دەیگۆرێت و بەپێچەوانەشەوە.

بۆ ادراج كردنی تەنها ئەو خاڵانەی كە لە وصفیان نوسراوە H بۆ ناو رەسمەكە: دەستنیشانی ئەو خاڵانە دەكەین...كلیك لەسەر فەرمانی Raw Desc دەكەین ئینجا تەنها یەكەم خاڵ دەست نیشان دەكەین كە لە كۆلۆمی وەصفی تەنها H نوسراوە Shift دادەگرین ئینجا دوا خاڵیش كلیك دەكەینەوە كە مەبەستە...ئینجا كلیكی راستی ماوس دەكەین لیستێك ئەكرێتەوە ...تیایدا فەرمانی Insert into drawing هەڵدەبژێرین

فەرمانەكانی تری ئەم لیستە بەم شێوەیەن:

Remove From Drawing بۆ رەش كردنەوەی خاڵەكان تەنها لە رەسم (نەوەك لە داتابەیسەكەوە).

Erase بۆ رەش كردنەوەی خاڵەكان بەشێوەیەكی گشتی (واتە لە رەسمەكەو داتابەیسەوە).

Lock بۆ قفل كردنی خاڵەكان بۆئەوەی گۆرانكاری هێنان و رەشكردنەوەی نەكرێت

Unlock بۆ كردنەوەی قفلەكە.

Print Setup ئامادەكردنی پرینتەر.

Print بۆ پرینت كردن.

Print to file بۆ پرینت كردنی بۆ فایلی دەرەكی.

Clear Selaction دەستنشانی كردنەكە لابە.

## چۆن خاڵەكان لەشێوەی گروپ گروپ ئامادە دەكرێن؟







رێگای یەكەم: كاتی هێنانیان لە Import ...هەر فایلێك بەتەنها بهێنرێت بەهۆی فەرمانی Points → import/Export point→import points ئەم پەنجەرەیەت بۆ دەكرێتەوە ئینجا كلیك لەسەر چوارگۆشەكەی Add Point To Points Group دەكەین بۆئەوەی دەستنیشان بكرێت, ئینجا لە خانەكەی خوارەوە ناوێك دەنوسین بۆ ئەوەی تعبیر لە خاڵەكان بكات .... بەهەمان شێوەی یەك لەدوای یەك فایلەكانی تریش داوا دەكەین...ئەم هەنگاوەش دووبارە دەكەینەوە.

ڕێگای دووەم: کاتێك هەموو خاڵەکان بەیەك جار Import دەکەین ئینجا:





١–هەموو خاڵەکان ڕەش دەکەینەوە لە ڕەسمەکە بەهۆی فەرمانی Remove from drawing ئینجا All Points

فەرمانی List Point → Points هەڵدەبژێرین ئینجا ئەو خاڵانەی کە دەمانەوێت بیکەین بە گرووپێك ئینجا کلیك بەلای ڕاستی ماوس ئینجا Insert into drawing ئینجا فەرمانی Create Group, ئینجا ناوی گرووپەکە دەنووسین دوایی فەرمانی include وە فەرمانی With Number Matching دەستنیشان دەکەین دوایی فەرمانی Selection Set in Drawing ئینجا هەموو ئەو خاڵانە هەڵدەبژێرین کەلەسەر شاشەکە هەن دوایی Enter دوایی .OK

بۆ دڵنیابوون پەنجەرەی Point Group بکەوە ناوی ئەو لایەرەی کە دروستمان کردبوو دەبینین دوایی فەرمانی Build List ئینجا List سەیرکە هەموو خاڵەکانی گرووپەکە دەبینین.

٢–بۆ دروست کردنی گرووپ لەناو ڕەسمەکە ئەم فەرمانە هەڵبژێرە:

Points → Point Management → Point Group

ئینجا Create Point Group پەنجەرەی هەنگاوەکانی فەرمانی List Point کە لەسەرەوە بۆمان کراوە, دەکرێتەوە.



کاتێك ئێمە شەبەکەیەکی ناوخۆ لە شەقام دروست دەکەین, فایلێکی گەورە دروست دەبێت لە خاڵەکان ...جگە لەبونی وەصفێکی زۆر بۆخاڵەکان, بۆ نمونە خاڵەکانی کۆنترۆل, ئینتێرسێکشن, ستونی کارەباو عەبارات و ستونی تەلەفۆنەکان و ڕوناکەرەوەکان, شوێنی دارەکان ....هتد پێویستە ڕەچاو بگیرێت لەکاتی دیزاین کردن....وە پێویستە هەریەك لەمانە هێمای خۆیان هەبێت بۆ ناسینەوە وەکو لەم تەبیلە روون کراوەتەوە...

| پێناسەکەی | هێما | ژ |
|---|---|---|
| ستونی کارەبا | E.P | -١ |
| ستونی تەلەفۆن | T.P | -٢ |
| مانهۆلی کارەبا | E.M | -٣ |
| مانهۆلی تەلەفۆن | T.MH | -٤ |
| مانهۆلی مالەوە | M | -٥ |
| بینایە | H | -٦ |
| پەرژین | W | -٧ |
| کابینەی تەلەفۆنی سەندوقی | C.T | -٨ |
| کابینەی کارەبای سەندوقی | C.E | -٩ |
| خالی مەسح کردنی تۆپۆغرافی (Spot Levels) بە پانایی و درێژی | S.L; AR.S.L | -١٠ |
| هێلی ئاو | W.P | -١١ |
| مزگەوت | MO | -١٢ |
| پشتەشانەکان و کێربەکان | SH | -١٣ |
| جەزرەی ناوەراست | IS | -١٤ |
| ستەیشنی پەترۆل | PS | -١٥ |
| بیرەکانی ئاو | WELL | -١٦ |
| پەنجەرەی ستیل | STEEL NET | -١٧ |
| دەرگا | D | -١٨ |
| مانهۆلی تەلەفۆنی گشتی | MH.T(MAIN) | -١٩ |
| رێگای کۆنکریتی | C.R | -٢٠ |
| پردی کۆنکریتی | IR-X | -٢١ |
| قەنتەرەکان | CULVERT | -٢٢ |
| خالی گەرانەوە (Control Points) | BM | -٢٣ |
| دینەمۆی کارەبایی | E.T | -٢٤ |
| پردی پەرینەوەی کۆنکریتی | P.B | -٢٥ |
| حەوزی ئاو | W.B | -٢٦ |
| دابەشکەری تەلەفۆن | T.B | -٢٧ |
| تانکی ئاوە بەرزەکان | O.H.W.T | -٢٨ |
| تانکی ئاوەکان | W.T | -٢٩ |
| رێرەوی ئاوەرۆ (Storm Water Drainage CL Alignment) | DR.AL | -٣٠ |

هەریەك لەم هێمایانە وێنەیەكی تایبەتی دەبێت لە ئۆتۆكاد.....دەتوانیت ئەوەی سەرەوە جێبەجێبكەین بەهۆی فەرمانی

Points → Points Management → Descrption Key Management




Default هەڵدەبژێرین

Coda هێمای وەصف كردنە لە بەرنامەی Excel واتە (شۆرت كات) دەبێت

Format ئەو هێمایە دەبێت كە لاند لەتەنیشت خاڵەكە بۆتی دەنوسێت

Point Layer ئەو لایەرەی كەوا خاڵەكەی لەسەر دەنوسرێت.

Symbol Block Name ناوی رەسمەكە وەكو بلۆك.

Symbol Layer ئەو لایەرەی كە بلۆكەكەی لەسەر رسم دەكات.

| Code | Format | Point Layer | Symbol Block Name | Symbol Layer |
|---|---|---|---|---|
| STA# | $* | PNT-SURV | STA | PNT-SURV |
| TR | TREE | PNT-TOPO | CG_T30 | TOPO |

دوایی كلیك لەسەر شوێنێكی بەتاڵ بكە بەلای راستی ماوس فەرمانی

Creat Descreption ئەمانە بنوسە لەبەردەم فەرمانەكان

Coda هێمای D

Format هێمای DOOR

Point Layer لایەری DOOR

Symbol Block Name هەڵبژێرە dmh

Symbol Layer لایەری DOOR1 ئینجا OK دوایی CLOSE

بۆجێبەجێكردنی فەرمانەكانی سەرەوە

Points→ Create Point→ Manual

ئێستا هەر خاڵێك كە Import بكەیت لە ئەكسل بەفەرمانی

Import Point هەموو ئەو هێمایانەی لەسەرەوە پێناسەكراون بۆمان ئەهێنێت.

| | A | B | C | D | E | F | G | H | I |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 1 | , | 10001.37 | , | 10046.45 | , | 102.87 | , | as |
| 2 | 2 | , | 10000.8 | , | 10005.92 | , | 100.25 | , | as |
| 3 | 3 | , | 10016.25 | , | 10063.91 | , | 104.71 | , | as |
| 4 | 4 | , | 9997.9 | , | 10006.69 | , | 100.20 | , | as |
| 5 | 5 | , | 10018.07 | , | 10061.72 | , | 104.71 | , | as |
| 6 | 6 | , | 10019.98 | , | 10059.62 | , | 104.65 | , | as |
| 7 | 7 | , | 9994.94 | , | 10006.96 | , | 100.10 | , | CL |
| 8 | 8 | , | 10037.79 | , | 10079.81 | , | 107.04 | , | x |
| 9 | 9 | , | 10001.04 | , | 10024.86 | , | 101.26 | , | x |
| 10 | 10 | , | 10035.89 | , | 10081.5 | , | 106.99 | , | x |
| 11 | 11 | , | 9998.35 | , | 10025.16 | , | 101.32 | , | x |

ڕێگای Comma delimited بۆ هێنانی خاڵەكان بۆ ناوبەرنامەكە:

١–بەم ریزبەندیە خاڵەكان داخل كە ,هەروەكو لەسەرەوەش باسمان كردووە:

NO E N ELE. DESC

٢–لەنێوان هەر کۆلۆمێك...کۆلۆمێکی بۆش جێبهێڵە ئینجا

لەناو ئەوکۆلۆمە هێمای (,) بنووسەوە.

٣–فایلەکە Save as بکەوە بەناوی خۆی یان هەرناوێکی تر,

بەلآم بە ئێکستێنشنی

Formatted text (space delimited. Prn)




٤–لەناو بەرنامەی لاند ئەم فەرمانە ئەنجام بدە:

Import point ← Import/ Export ← point

لەوپەنجەرەیە دەکرێتەوە....لە Format

PENZD (Comma delimited) دەستنیشان بکە




لە Source File شوێنی فایلی ئەکسلەکە یان فایلە جۆرە prn

بدۆزەوە.

٥–پەنجەرەیەکی تر دەکرێتەوە ....وەکو لەسەرەوە باسمان کردووە....برۆ بۆ

سەرەوە.

هەموو خاڵەکان دێنە ناو بەرنامەکەو ئەگەر دیار نەکەوتن Z بنووسە دوایی

E ئینجا Enter ...خاڵەکان دەردەکەون.

## چۆنیەتی داخل کردنی خاڵەکان بەشێوەی Manual:




گرنگ ترین ڕێگاکان:

١–بەهۆی فەرمانی Point→ create point → manual

بەهۆی ماوس شوێنی خاڵەکە هەڵدەبژێرین (X,Y) یان(E,N) ئینجا

وەصفەکە داخل دەکەین بۆ نمونە(tr دار) دوایی بەرزیەکە, ئینجا ئەم

هەنگاوانە دووبارەکەوە....ڕەنگی زەردەکە ژمارەی خاڵەکەیە, ڕەنگی سور

بەرزیەکەیە, ڕەنگی سەوز وەصفەکە دەنوێنێ.

٢–بەهۆی فەرمانی Northing ← create point←point

(ڕێگای کۆردینەیتەکان) N داخل دەکەین, دوایی E ئینجا وەصفەکەو

بەرزیەکە هەرجارێکیش Enter دابگرە.

دەتوانین کۆنترۆلی ڕێگای پێشاندانی زانیاریەکان بکەین بەهۆی فەرمانی:create –point setting – point

ئینجا None دابگرە, گەر بتەوێت هەلبژاردەکە دەرکەوێت یان Manual یان Automatic بۆ پیشاندان یان شاردنەوەی

وەصفەکە, بەرزیەکە, کۆردینەیتەکە.

## چۆنیەتی گۆرینی ڕەنگ و جۆرو سایزی فۆنتەکە بۆ ئەو خالآنەی کە Import دەکرێت

بەهۆی فەرمانی point ← point setting

‎# Marker : بۆ گۆرینی نیشانەکە.

‎# Text بۆ گۆرینی رەنگ و سایزی ژمارەی خالـەکان.

## چۆنیەتی گۆرینی رەنگ و جۆرو سایزی فۆنتەکانی خالـەکان کە پێشتر Import کراون

Point→ Edit Point → display prop

چەند ئۆپشنێك دەردەکەوێت, یان هەموو خالـەکان یان گرووپێك لەو خالانە, یان دەستنیشانکردنی چەند خالێك ویان رەقەمی خالـەکان.




بنووسە A دوای Enter بکە, پەنجەرەیەك دەردەکەوێت, هەرشتێکت بوێت دەتوانیت تیایدا بیگۆریت.

## چۆنیەتی شوێن گۆرین و دەستکاری کردن و دووبارەکردنەوە رەش کردنەوەی خالـەکان لە داتابەیسی جیودیس

Edit point ← point

Move: بۆ شوێن گۆرین

Erase: بۆ رەش کردنەوە بەشێوەیەکی کۆتایی.

Copy: بۆ کۆپی کردن

## چۆنیەتی ناردنی خالـەکان لـەناو بەرنامەی لاند بۆ دەرەوە

بەهۆی فەرمانی point ← Import / Export ← Export

لەبەردەم Format شێوەی فایلەکە, لـەبەردەم Destination File ناوی فایلەکە دەستنیشان بکەو ئنجا OK هەموو خالـەکان دەگواسترێنەوە بۆ ناو بەرنامەی Excel..... دوای لـەناو بەرنامەی ئەکسل دەیکەیتەوەو تەنسیقەکەی دەگۆریت و دەریدەهێنیت.

## چۆنیەتی زیادکردن و شاردنەوەی خالـەکان لە داتابەیسەوە

کاتی هێنانی خالـەکان بۆ ناوبەرنامەی لاند دیسکتۆپ, بەرنامەکە دەست بەسەبر بوون دەکات قورسایی درەنگی دەکات... لە فەرمانە گرنگەکان بۆ خێراکردن, رەش کردنەوەی خالـەکانە لە رەسمەکە بەهۆی فەرمانی

Point → Remove from drawing

لـەکاتی پێویست بوون, دەتوانین بیان هێنینەوە لـەداتا بەیسەوە بەهۆی فەرمانی:

point → Insert point

## چۆنیەتی هێنانی خاڵەکان بۆ ناو بەرنامەکە بەشێوەی ئۆفسێت و بەرزی؟

ئەم ڕێگایە کۆنە بۆ دروست کردنی خاڵەکانی ڕووپێوی تەنها بۆ زانین وەریدەگرین

پێویستە خاڵەکان هەروەکو لەوێنەکە دیارە داخل بکرێتە ئەکسل فایلەکە خەزن دەکەینەوە بە ئێکستێنشنی(أمتداد)

Formatted Text (space delimited)

| | A | B | C | D | E |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | 0 | , | 0 | , | 100 |
| 2 | 0 | , | 12 | , | 100.5 |
| 3 | 0 | , | -15 | , | 100.45 |
| 4 | 25 | , | 0 | , | 101.2 |
| 5 | 25 | , | 5 | , | 101.5 |
| 6 | 25 | , | 13 | , | 101.9 |
| 7 | 25 | , | -8 | , | 102 |
| 8 | 25 | , | -14 | , | 103.7 |
| 9 | 50 | , | 0 | , | 102.1 |
| 10 | 50 | , | 6 | , | 102.8 |
| 11 | 50 | , | 12 | , | 103 |

لەبەرنامەی لاند بەهۆی فەرمانی:

Points → Create Point → Alignment → Import from File

فایلەکە دەستنیشان دەکەین ئینجا Open دوایی ژمارە ٢ هەلبژێرە ئینجا Enter دوایی ژمارە ١ ئینجا Enter وە Enter دیسان Enter کلیك بکە ...لەرەسمەکە دەردەکەوێت

لە لیستی Point ئەم فەرمانانە دەبینیت کە ئەمە کارەکانیانە

Lock point: بۆ قفل کردنی دەستکاری کردن و ڕەشکردنەوەی خاڵەکان.

point ← unlock poin بۆ کردنەوەی قفل کردن

list arailable: بۆ نیشان دانی ژمارەی خاڵە ئەکتیڤەکان.

Quick view: بۆ پیشاندانی خاڵەکان بەشێوەیەکی خێرا.

zoom to point: بۆ گەران و پیشاندانی خاڵەکان ژمارەکەی داخل دەکەین ئینجا مقداری گەورەکردنەکە.

zoom to extents: بۆ پیشاندانی هەموو خاڵەکان بەیەك جار.

drawe extents: بۆ ڕەسم کردنی ڕاستەهێلێك لەسەر خاڵەکان.

replace softdesk بۆ خوێندنەوەی خاڵەکانی Soft.

# وانەی سێیەم

## چۆنیەتی دروستکردنی سەتحێك هەموو خاڵەکان بەیەکەوە ببەستێتەوە




سەتح (سەرفەیس) بریتیە لە کۆمەڵە خەتێك خاڵەکان بەیەکەوە دەبەستێتەوە بەهۆی TIN ...ئەمەش دەبێتە یارمەتی دەرێك بۆ دۆزینەوەی هەر زانیاریەك لەنێوان خاڵەکانەوە.

بۆ دروست کردنی هەرسەتحێك ئەم فەرمانە بەکار دەهێنین:

Terrain model explorer ← Terrain

بەلای راستی ماوس کلیك دەکین لەسەر Terrain ئینجا Create New Surface هەلبژێرە .... Surface1 بۆ دروست دەبێت.

بەلای راستی ماوس کلیکی لەسەر دەکین بۆ ئەوەی Rename بکەینەوە....بۆ نمونە (Point 1) ئینجا کلیك لەسەر نیشانەی (+) بکە.

بەهۆی Point Files خاڵەکانمان Add دەکەین.

کلیك بکە بەلای راستی ماوس ئینجا ئەم فەرمانە هەلبژێرە:

Point←Add points from AutoCAD objects

دەگەڕێینەوە ناوبەرنامەکە هەموو خاڵەکان تحدید بکەو E بنووسە ئینجا Enter.

کلیك بەلای راستی ماوس لەسەر سەتحی Point 1 بکەو ئینجا فەرمانی Build دوای Ok.

بۆ پیشان دانی شێوەی سەتحەکەو دڵنیابوون لە نەبونی هەڵە

Quick view ← Surface display ← Terrain










### چۆنیەتی دروست کردنی سەتحێك تەمسیلی رێگای بەستنی هەموو خاڵەکان بنوێنیت لە فایلێکی دەرەوەی بەرنامەکە:

هەروەکو رێگای پێشەوەیە بەلام لەشوێن ئەوەی هەنگاوی فەرمانی

Add Points Autocad Objects

فەرمانی Add Point File بەکاربهێنە

گۆراوەکان دەست نیشانکەو ئینجا دایرێکتەرەکە دوایی OK

ئینجا OK.

دوایش Build ئینجا OK.

ئەم ڕێگایە گونجاوە بۆ دروستکردنی سەتحەکان چونکە سایزی
پرۆژەکە بەشێوەیەکی بەرچاو کەم دەکاتەوە...بەلاّم دەبێت
دلنیابین لە خالەکان لەفەرمانی Import لە لیستی Point.




چۆن دەتوانێت Import دەستکاری سەتحەکان بکرێت؟
یەکەم جار بۆ دروستکردنی هێلکاری شەبەکەی سەتحەکە
بەشێوەیەکی کۆتایی بەهۆی فەرمانی
Import 3D line ← Edit surface ← Terrain
ئینجا دەستکاری دەکەین بەیەك لەم فەرمانانە




بۆ زیادکردنی ڕاستەهێلێك لەنێوان دوو خال بەهۆی فەرمانی
Add line ←Edit surface ← Terrain
ئینجا دووخالەکە هەلبژێرە کە ڕاستەهێلەکەی بۆ دروست بکات.
بۆ ئەوەی بەرنامەکە خۆی ئەوەمان بۆ ئەنجام بدات لە فەرمانی:
Flip face ← Edit surface ← Terrain
بۆ دروست کردنی خالێك کە بەرزیەکی نوێی هەبێت, چەند ڕاستەهێلێك
دروست بکەین بەهۆی فەرمانی:
Add point←Edit surface ← Terrain
بەلاّم بۆ ڕەشکردنەوەی خالێك لەگەل ڕاستەهێلەکانی پێیەوە بەستراوە
بەهۆی فەرمانی
Delete point ←Edit surface ← Terrain
ئاگاداربە کە هەرفەرمانێکی سەرەوە ئەنجام بدەیت پێویستە دەستکاریەکان Save بکەینەوە بەهۆی فەرمانی save Current
surface ....ئینجا دووبارە سەتحەکە ڕەسم دەکرێتەوە بەهۆی فەرمانی Import 3D line.

# وانەی چوارەم

## چۆنیەتی دروست کردنی هێلکاری کەنتۆری




بەهۆی فەرمانی Terrain ← Create contour

دەستنیشانی ئەو سەتحە بکە کە دەمانەوێت لەسەریەوە پەیوەست بێت, دوایی OK.

پەنجەرەیەکی تایبەت بە کەنتۆر دەکرێتەوە, دەستنیشانی ئەمانە بکە:

ناوی ئەو سەتحە دەستنیشان بکە کە دەمانەوێت کەنتۆرەکەی لێوەی دروست بکەین.

گەورەترین و نزمترین بەرزی خالەکان دیار بکە.

بۆ دروستکردنی هیلەکانی تەسویەی سەرەکی Major دابگەرە بۆ

دروست کردنی هێلەکانی تەسویەی لاوەکی Minor دابگرە... یانیش

Both کە ئێمە ئەوە دادەگرین.

دوای کلیك کردن لەسەر OK دوو لایەرمان بۆ دروست دەکات,

بەناوی CONT MNR وCONT MJR




### چۆن دەستکاری فۆنت و نوسینەکان و دەرجـەی شـکانەوەی هێلکاری کەنتۆری دەکرێت؟

بەهۆی فەرمانەکانی:

create contour – Terrain

کلیك لەسەر Style manager بکە.

یان لە لاپەرەی **contour appearance**

دەستنیشانی Contours Only بکە.

وە labels and Grips هەلبژێرە.

بکە line width = 0




هەروەها ئەستوری راستهێلی کەنتۆری:–

بەهۆی smoothing options دەستکاری نەرمی و تیژی و

شکانەوەی خەتەکانی کەنتۆری دەکەین

No smoothing جۆری لوس و تیژی خەتەکان هەلدەبژێرین

Add vertice بەشێوەی رێژیی خەتەکان لوس و رێك دەکەین

Splin curve شێوەیەکی لوس و رێك وەردەگرێت

لەلاپەرەی Text styel



جۆری فۆنتەکان لەبەردەم فەرمانی Style وە رەنگەکەش لە Color وەزیادکردنی پیت یان هێمایەک لەپێش ژمارە بەهۆی فەرمانی Perfix وە لەدوای ژمارەکەش suffix ,وەبەرزی سایزی نوسینەکان لە Height دەگۆڕین.




### لە لاپەڕەی label position:

بەهۆی فەرمانی Orientation دەستنیشانی چۆنیەتی نوسینی ژمارەکانی سەر هێڵی کەنتۆری یان ژێری یاخود لەناویەوە بێت نیشانە دابنێ لەبەردەم فەرمانی break contour for label بۆ ئەوەی هێڵی کەنتۆریەکە بگەینیت یاخود ببڕێت لەشوێنی گەیشتن بە نوسین.

لەفەرمانی Readability دوو بەشە فەرمانی تر هەن:

Make plan Readable پەیوەندە بە پلانی رەسمەکە.

ئاراستەی Label positive slope گرەید موجەبە.




### لاپەڕەی manage styles:

دەتوانیت بەهۆیەوە Style (سیستەم)ێکی تایبەت بەخۆت دروست بکەیت هەر دەستکاریەکی کە لە لاپەڕەکانی تر دروست کردبێت بەناوێك لە contour styles in drawing خەزنی بکەیت, ئینجا کلیك لەسەر add بکەین هەرکاتێك پێویستت پێی بێت داوای بکەیت.




### چۆن نووسین لەسەر هێڵێکاریەکانی کەنتۆری دەکەین؟

بەهۆی ئەم فەرمانانەوە دەبێت بەپێی پێویست:

End ← contour  label ←Terrain

بۆ نوسینی بەرزیەکە لە کۆتایی هێڵی کەنتۆری

- Group end

بۆ نوسینی بەرزیەکە لەکۆتایی گرۆپێك هێڵی کەنتۆری کە هەڵیان دەبژێرین بە گروپ

- Interior

بۆ نوسینی بەرزیەکە لە ناوەڕاستی هێڵی کەنتۆری .

- Group interior

بۆ نوسینی بەرزیەکە لە ناوەڕاستی گرووپێك هێڵی کەنتۆری.

دوای هەڵبژاردنی هەر فەرمانێکی سەرەوە دەبێت دەستنیشانی کمیەی زیادبونی هێڵەکە بنوسین ئینجا OK دوایی هێڵێك دەکێشین ئەو هێڵە کەنتۆریانە ببڕێت کە دەمانەوێت بەرزیەکەمان بۆ بنوسێت.

# وانەی پێنجەم

## دەستنیشان کردنی مساری (ڕێڕەو) ڕێگاکە

بێگومان دیاری کردنی مساری ڕێگا بەندە لەسەر ئەو پێویستیانەی کە لەسەری ڕێککەوت دەکرێت وەکو جۆری ڕێگاکەو شێوەکەو پلەو ئەو مەبەستانەی کە ڕێگاکەی بۆ دروست دەکرێت

أ–ڕێگای گوندەکان (خۆرایی):

ئەو ڕێگایانەن کە لەسەر ڕێرەوی دروست کراوی خۆی کە خەلکەکە بەکاریان هێناوە وەك ڕێگایەك بۆ هاتووچۆ... ڕێگاکە دروست دەکرێتەوە بەلام ئەمجارەیان بەشێوە ئەندازەیەکەیەوە.

دەستنیشانی خالەکانی (PI) و خالەکانی (B.M) دەکرێت هەر لەسەر ڕێگاکە, وە بەشێوەیەکی نزیك نرخی (E) دیاری دەکرێت بۆ سەنتەری ڕێگاکە ئینجا خالەکان بەهۆی (Total Station) بەشێوەی کۆردینەیتی (E,N,Elev.), ئینجا ئەم خالانە دەدرێتە دیزاینەر بۆ داخلکردنی بۆ ناو بەرنامەی لاندو رەسم کردنی مساری افقی و دەرهێنانی سەنتەری ڕێگاکە هەر (٢٥)م, ئینجا خستنەوەناو ئامێری تۆتەل ستەیشنەوە بۆ ئەوەی تسقیتی خالەکان بکرێت لەئامێرەکەوە.

خالە بێهێزەکانی ئەم ڕێگایە ئەوەیە کە دیزاینەر ناتوانیت دیزاینی هۆریزۆنتل کێرڤ بکات بەگوێرەی خێرایی دیاریکراوو مواصفاتی ڕێگاوبان.

ب–ڕێگای شارستانی:

هەر دیزاینەرێك ڕێگای تایبەتی خۆی بەکاردەهێنیت... بۆنمونە:

ڕێگای کەنتۆری.... ڕێگای بەرزکردنەوە هەموو ٢٠ مەترێك .... ڕێگای بەرزکردنەوەی سەرەتایی بۆ دیاری کردنی ڕێرەو ئینجا بەرزکردنەوەی کۆتایی بەگوێرەی Profile & Cross Section.

بەلام باشتر وایە لەگەل خاوەن کار ڕێکەویت بۆ دەستنیشانکردنی ڕێگای کارکردن.

ئاگاداری: کاتی داواکردنی دقەی زۆر بۆ دیزاین کردنی ڕێگایەکی Special پێویستە داوا لە ڕوویپێوبکرێت کە کار بە Menu Prazm بکات ئینجا بەرزکردنەوەی سەرەتایی لەسەر ڕێگاکە دەبێت و دوایی دەدرێتە دیزاینەر بۆ دیاری کردنی مساری ڕێگاکەو اسقاتکردنی هەر ٢٠مەترێك ئینجا کرۆس سێکشن.

### چۆن ڕەسمی مساری ڕێگای چۆلەکان دەکرێت؟

دەبێت لەلامان زانیاری (PI) هەبێت لەڕوویپێوەوە وەرگیرابێت لەشێوەی تەیبلێك جگە لە مسافەی (E).

ئەم خالانە دەخرێتە ناو بەرنامەی لاند بەو ڕێگایانەی کە لەسەرەوە خوێندمان

لایەرێك دروست دەکەین ناوی بنێ (Alignment) ڕەنگەکەی بکە بە سەوزو ئینجا لایەرەکەش ئاکتیڤ بکە.

بەهۆی Polyline ڕاستەهێلێك دروست بکە بە هەموو خالەکانی (PI) برووات.

فەرمانی Alignment ← Define from polyline

بەکاربهێنە بۆ پێناسەکردنی مساری ڕەسم کراو.




کلیك لـەسەر راستەهێڵە رەسم کراوەکە بکەو ئینجا Enter بکە.

پەنجەرەیەك دەبێتەوە, تیایدا ناوی مسارەکە بنووسە بۆ نموونە (Center) لـەبەردەم Alignment Name بنووسەو وەسفێك بنووسە لـەبەردەم Description.

لـەکۆتایدا ستەیشنی دەستپێکردن بنووسە بۆ نموونە (٠) لـەبەردەم starting station ئینجا OK.

بەهۆی فەرمانی Create Station Label → Alignment مسار استیراد دەکەین.

بۆ داخل کردنی زانیاری زیاتری هۆریزۆنتل کێرڤ بەهۆی فەرمانی Edit ← Alignment

کلیك لـەسەر (PI) دووەم بکە نەوکاتیك پەکەیەك ئینجا برۆ بۆ فەرمانی Edit Curve ئینجا E چوونەژوورەوە بنووسەو ئینجا Next ئینجا E2 ...هتد, بەم شێوەیە لە کۆتایی ok–ok–save.

لـەدوایی مەسارەکە دەهێنین بەهۆی Create Station Label → Alignment

لە Command Line نوسراوە کە ئایە دەتەوێت ستەیشنەکان بە ٠٠+٠٠ دەستپێبکات کلیك لـەسەر Enter بکە.

ئینجا ئایە دەتەوێت هەتا کۆتاییەکەی...کلیك لـەسەر Enter بکە.

ئایە ئەتەوێت ئەوەی کۆن رەش بکرێتەوە Yes یان No.

بەمەش مسارەکەمان بۆ دەردەکەوێت لـەگەڵ زانیاریەکانی رەسمەکە.

## چۆن زانیاری Horizontal alignment دەردەهێنین

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Edit

هەلبژێرە لە راپۆرت فەرمانی Report Increment ئینجا Ok

OK... دوایی مەسافەی (٢٥)م دابنێ ئینجا Ok زانیاری (N,E) بۆ هەموو ستەیشنەکان دەردەکەوێت, دەتوانیت کلیك لـەسەر save in file بکەیت بۆ خەزنکردنی لـەشوێنێکی دیاری کراو, ئینجا لە بەرنامەی ئەکسل دەتوانیت فایلـەکە بکەیتەوە ئامادەی بکەیت ... دوایی بیخەینە ئامێری Total Station بۆ بەردەوام بوون لـەکارەکان و تسقیت کردنی هەموو ستەیشنەکان و ئینجا دووبارە بەرزکردنەوەی.

Horizontal Alignment Editor

Project: al ashwal branch Alignment: center

Edit

Insert PI | Delete PI | Edit Curve | Edit Spiral

| Station | Northing | Easting |
|---|---|---|
| 0+000 | 1009.810 | 888.490 |
| 0+052.22 | 980.980 | 932.030 |
| 0+134.63 | 975.000 | 1014.920 |
| 0+198.58 | 990.580 | 1077.350 |
| 0+244.13 | 1018.600 | 1113.990 |
| 0+371.82 | 1077.600 | 1227.330 |
| 0+447.79 | 1120.740 | 1289.960 |

| Distance | Direction |
|---|---|
| 52.220 | S 56-29-22 E |
| 83.105 | S 85-52-25 E |
| 64.345 | N 75-59-15 E |
| 46.126 | N 52-35-37 E |
| 127.777 | N 62-30-02 E |
| 76.050 | N 55-26-26 E |

Home | Page Up | Up | Down | Page Down | End

Reports

Settings... | Station | Curve | Station/Curve | By Increment

OK | Cancel | Help | Save

## چۆن دەستکاری مسار دەکرێت بەهۆی PI و Curve ؟

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Edit

پەنجەرەیکت بۆ دەکرێتەوە کارەکانی بەم شێوەیە دەبێت:

Station ستەیشنی خالی یەکتر برین PI.

Home گەرانەوەت بۆ یەکەم لاپەرە.

End گواستنەوەت بۆ دوا لاپەرە.

Northing کۆردینەیتی باکوور.

Easting کۆردینەیتی رۆژهەلات.

up , down بەرزکردنەوەو دابەزاندن بەقەد یەك رستە.

Distance مەسافەی نێوان PI.

Page Down , Bage up بەرزبونەو دابەزاندن بەقەد یەك لاپەرە.

Insert PI زیاردکردنی خالی یەکتر برینی نوێ.

Delete PI رەشکردنەوەی خالی یەکتر برین.

Edit curve بۆ زیادکردن و دەستکاری کردنی هەر کێرڤێکی ئاسۆیی.

Edit spiral زیادکردن و دەستکاری کردنی هەر کێرڤێکی گواستنەوە کە دەبێت نرخی L1,L2 پێبدرێت.

هەر لـەهەمان پەنجەرە شوێنێکی تایبەت بە فەرمانی Report هەیە بەم شێوەیە بەکاردێت:

Setting بۆ دەستنیشان کردنی جۆری پەرەکەی لـەسەری پرێنت دەکەین هەروەها شێوەی پیشاندانی لـە فایل و شاشەکە.

Station بۆ دەرهێنانی راپۆرتەکە بەگوێرەی خالـەکانی یەکتربرین PI.

Curve بۆ دەرهێنانی راپۆرتەکە بەگوێرەی کێرڤەکان و رونکردنەوەکان.

Stat/curve بۆ دەرهێنانی راپۆرت بەگوێرەی خالـەکانی PI و کێرڤەکان.

By increment بۆ دەرهێنانی راپۆرت بەگوێرەی خالی ستەیشنەکانی کۆردینەیتەکان و بەرزی خالـەکان.

ئالـەم وێنەیەدا راپۆرتەکە بەگوێرەی هۆریزۆنتەل کێرڤ دەرهاتووە.

```
Project: Biet Al-Ashwal Biet Nsairy Project Road
Horizontal Alignment Station and Curve Report.
Alignment: center line of road

Station     Spiral/Curve Data      Northing      Easting
----------------------------------------------------------
PI   0+000                         9282.6636    12135.8207
       Length:     66.591  Course:  N 73-33-19 E
----------------------------------------------------------
PI   0+066.59                      9301.5150    12199.6880
       Length:     67.231  Course:  N 50-26-11 E
       Delta:    23-07-08
----------------------------------------------------------
             Tangent Data
     0+000                         9282.6636    12135.8207
     0+050.23                      9296.8829    12183.9948
       Length:     50.229  Course:  N 73-33-19 E
----------------------------------------------------------
             Circular Curve Data
PC   0+050.23                      9296.8829    12183.9948
RP                                 9373.6103    12161.3475
PT   0+082.51                      9311.9369    12212.3022
       Delta:    23-07-08   Type:       LEFT
       Radius:     80.000   DOC:      71-37-11
       Length:     32.280  Tangent:     16.363
       Mid-Ord:     1.623 External:      1.656
       Chord:      32.061  Course:  N 61-59-45 E
       Es:        1.656
----------------------------------------------------------
PI   0+133.38                      9344.3370    12251.5180
       Length:     77.849  Course:  N 31-43-06 E
```

**Station Increment**

**Project: Biet Al-Ashwal Biet Nsairy Project Road**

**Units: meter**

**Horizontal Alignment Information**

| Station | NORTH | EAST | Elevation | |
|---|---|---|---|---|
| | | | Center eg | Center FG |
| 0+000 | 9282.6636 | 12135.8207 | 129.823 | 129.55 |
| 0+012.50 | 9286.2022 | 12147.8093 | 130.734 | 129.752 |
| 0+025 | 9289.7408 | 12159.798 | 131.644 | 129.955 |
| 0+037.50 | 9293.2795 | 12171.7867 | 131.702 | 130.157 |
| 0+050 | 9296.8181 | 12183.7753 | 131.76 | 130.359 |
| 0+062.50 | 9301.244 | 12195.452 | 131.876 | 130.561 |
| 0+075 | 9307.4328 | 12206.2978 | 131.991 | 130.764 |
| 0+087.50 | 9315.116 | 12216.1501 | 131.751 | 130.966 |
| 0+100 | 9323.0776 | 12225.7865 | 131.511 | 131.168 |
| 0+112.50 | 9331.0393 | 12235.423 | 131.35 | 131.37 |
| 0+125 | 9339.1105 | 12244.9653 | 131.188 | 131.573 |
| 0+137.50 | 9348.3145 | 12253.4043 | 131.469 | 131.775 |
| 0+150 | 9358.6765 | 12260.3806 | 131.75 | 131.977 |
| 0+162.50 | 9369.3095 | 12266.9525 | 131.113 | 132.18 |
| 0+175 | 9379.9426 | 12273.5243 | 130.475 | 132.382 |

چۆن دەتوانرێت دەستکاری رێگای نووسینەکانی Station بکرێت لە Plan بەشێوەیەك بە ستونی دەرکەوێت هەر (٢٥)مەترێك؟

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Station label setting

ئەم پەنجەرەیە بۆ دەکرێتەوە:




Station labels بۆ دروست کردنی زانیاری دەربارەی ستەیشنەکان لە لایەرێکی تایبەت کە ناوەکەی لەبەردەم Layer دەبێت.

Station point labels بۆ دروستکردنی زانیاری لەسەر خالی ستەیشنەکان لە لایەری Layer.

Station Equation label بۆ دروستکردنی لایەرێکی تایبەت بە زانیاریەکانی خالی دەستکاری کراوی مسارەکە Connection

Per pendicular labels بۆ گۆرینی شێوەی نووسینی ستەیشنەکان ستون لەسەر مەسارەکەو نەوەك تەریب بێت.

Station read along road نوسینی ستەیشنەکان بەدرێژایی مەسارەکە دەبێت.

Plus sign location بۆ دانانی نیشانەی (+) وەهەروەها نوسینەکان لە سەنتەری هەریەك لەخالەکانی خۆی جێگیردەکات.

Station Label Increment بۆ نووسینی ستەیشنەکان هەموو (٥٠) م.

station Tick Increment بۆ دابەش کردنی مەسارەکە بەهۆی هێمای (–) هەر (٢٥) م

Station Label Offset دورستەوەی نووسینەکان لە سەنتەری ستەیشنەکانەوە.

بۆ نوێکردنەوەی زانیاریەکان فەرمانی label Alignment ← create station دابگرە.




- بەلاَم بۆ گـۆرینی هێمـای (+) هـەروەها ژمـارە دووبارەبووەکـانی دوای هێماکـە بـۆ هـەموو (١٠٠٠)مـەترێك بـەهۆی فـەرمانی Station display format ← Aligmamt

ئێنجـا نرخـی value Preview بگـۆرە بـۆ ١٠٠٠ وەهـەروەها دابەشکردەکەی ژێر ١٠٠٠ بۆ ١ واتە بۆ نەمانی دووبارە بووەکان لـە هەر ١٠٠٠ رێك.

هەر لـەم پەنجەرەیەوە دەتوانین هێمای (+) بگۆرین, جگە لە دیار خستن و شاردنەوەی ژمارەی خانەکان لـەفەرمانی Use station format

Min display width کـەمترین دەرکـەوتن بـۆ ژمـارەی دوای فاریزە پێش ژمارە راستەکان. نەوەك دوای هێماکە

بۆ نمونە:

01+000-02+000-03+000-…..-10+000

Drop decimal for even value بۆ نزیك کردنەوەی ژمارەکانی دوای فاریزەی دەیی بۆ نزیکترین ژمارەی راست

decimal character شێوەی هێمای دەیی.

# وانەی شەشەم

## چۆن دەتوانرێت دەستکاری ناوی هۆریزۆنتل کێرڤ بکرێت

بـۆ نمونـه PT بمانـەوێت بیکـەین بـه EC وه PC بکـەین بـه BC...هتد.

بەهۆی فەرمانی (Alignment labels)

ئینجا ئەوەی دەتەوێت دەیگۆڕیت.



Alignment Labels Settings

Layer Prefix

Layer prefix:

(Use * as the first character to include the alignment name.)

Label Text

| | | | |
|---|---|---|---|
| Station equation ahead: | STA AHEAD: | Curve/Spiral intersect: | CS |
| Station equation back: | STA BACK: | Spiral/Tangent intersect: | ST |
| Tangent/Tangent intersect: | PI | Spiral/Spiral intersect: | SS |
| Beginning of curve: | BC | Compound Curve/Curve intersect: | PCC |
| Curve/Tangent intersect: | EC | Reverse Curve/Curve intersect: | PRC |
| Radius point of curve: | RP | Curve point of intersect: | CPI |
| Tangent/Spiral intersect: | TS | Spiral point of intersect: | SPI |
| Spiral/Curve intersect: | SC | | |

OK Cancel Help

### چـۆن دەتـوانین ڕەسمـی مسـارێك بهێنینـەوە کـە لەڕەسمەکـە ڕەشکراوەوە بەهۆی کۆماندەکانی ئۆتۆکاد

بـەهۆی فـەرمانی Alignment ← Import دوایـی مسـارەکە دەستنیشان بکەو Ok.

### چۆن مسارێك ڕەش دەکرێتەوە لە ڕەسمەکە یان لـە داتابـەیس وەیان لەهەردوکیان؟



Alignment Offset Settings

Define offset alignments — Name prefix (optional):

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ☑ Outer offset | Left offset: | 3.750 | Right offset: | 3.750 |
| Layer: ROW | Left name: | | Right name: | |
| ☑ Second offset | Left offset: | 5.250 | Right offset: | 5.25 |
| Layer: SHOULDER | Left name: | | Right name: | |
| ☐ Third offset | Left offset: | 15.000 | Right offset: | 15.000 |
| Layer: SIDEWALK | Left name: | | Right name: | |
| ☐ Inner offset | Left offset: | 12.000 | Right offset: | 12.000 |
| Layer: EOP | Left name: | | Right name: | |

OK Cancel Help

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Delete

دەستنیشانی مسارەکە دەکەین و ئینجا ئۆپشنی ڕەشکردنەومان دەداتێ لە فایلەکە یان لەشاشە وەیان لەهەردوکیان ئینجا OK.

### چـۆن مسـارێك پانیەکـەی (٧,٥)م و شـانەباڵەکانی (١,٥)م دروست بکەین؟

بـەهۆی فـەرمانی Alignment ← Create offset کـە تیایـدا مسافەکە دەستنیشان دەکـەین لـە سـەنتەری ڕێگاکـەوە (٣,٧٥)م بـۆ هەردوو لاکـان, ئینجـا مسـافە لەسـەنتەری ڕێگاکـە بـۆ شـانەباڵەکان بنووسە (٥,٢٥)م بۆ هەردولاکان.

### ئایە چۆن دەتوانین بزانین کە ئایە ئەم مسافەیە Left یان Right, ئەگەر جیاوازی هەبێت لە Offset وەچۆن دەتوانین بزانین شوێنی ستەیشنەکەو ئۆفسێت؟

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Station / offset ← Label

١– شوێنی داواکراو دەستنیشان بکە (خاڵێك لەسەر هێڵەکە).

٢– سەهمەکە ببە بۆ ئەو جێگایەی دەتەوێت نوسینەکە بکەیت.

٣– Enter بکەو... ستەیشنەکەو دوریەکەی دەردەکەوێت.

بەلاَم بۆ دەستنشان کردنی خاڵێك (E,N)ی هەبێت

بەهۆی فەرمانی Alignment ← Station / offset ← Display point

Yes دابگرە بۆ بەیەك گەیاندنی خاڵەكە بە ستەیشنەوە.....ئینجا Selection بكەو خاڵێك (E,N) دەستنیشان بكە...Enter بكە بۆ دەركەوتنی زانیاریەكان.

جیاوازی نێوان ئەم دوو فەرمانە ئەوەیە كە یەكەمیان بەكاردێت بۆ پێناسەكردنی شوێنێكی نزیك ڕێگاكەیە بەلام دووەمیان بۆ پێناسەكردنی خاڵێك كە (E,N)ی هەبێت.

## كاتی جێبەجێكردنی مسارەكە تا شوێنێكی دیاریكراو .... ئەندازیاری سەرپەرشتار لەسەری كرا مسارەكە بگۆڕێت لەبەر هەر هۆیەك بێت ...دەبێت مساری نوێ بە مساری كۆن ببەستێتەوە ...؟

دوای رەسم كردنی مساری نوێ بو گۆڕین دەبێت دەست بە رەسمكردن بكەین لە PI مساری كۆن وە كۆتایی بە PI مساری كۆن بهێنین,EC بۆ دوا PI كە هەردوو مسارەكە تیایدا یەكدەگرن لەگەل درێژی Tangent (T) بۆ هەمان خال.

لایەرێكی نوێ دروست دەكەین ناوی بنێ Old Alignment ئینجا بیكوژێنەوە.

دەستنیشانی شوێنە كۆنەكە بكەو بیخە سەر لایەری سەرەوە بۆ ئەوەی لەرەسمەكە نەمینێت... دەستكاری مەسارەكە بكە...پێش دەستكاری كردن... ئینجا مساری نوێ....دوایی مساری دوای دەستكاری كردن.

مسارە نوێ پێناسەكە بەهۆی فەرمانی Define From Object ← Alignment

سەرتای مەساری كۆن هەلبژێرەو ئینجا هەموو مسارەكە دەستنیشان بكەو دوایی Enter بكەو Enter وەناوبنێ بۆ مەسارەكە Connection 1.

فەرمانی Edit هەلبژێرە لە لیستی Alignment دوایی برۆ بو دوا PI لە نوێ, ئینجا نرخی T بنووسە ... زانیاریەكانی تری مەساری نوێ بنووسە لە مەسافەی هاتنەژوور.

فەرمانی Station Equations ← Alignment بەكاربهێنەو بنووسە A ئینجا خالی Back Station هەلبژێرە كە خالی E.C یە كە هەردوو مەساری كۆن و نوێ تیایدا یەكدەگرن, ئینجا Enter بكە, داوای Head Station دەكات, ئەویش بریتیە لە E.C مەساری كۆن دوایی Enter ئینجا Enter بكە.

بۆ سەیركردنی دەستكاریە تازەكان برۆ بۆ Create Station ....بۆ ئەوەی بزانین كارەكەمان راستە دەبێت درێژی مەساری كۆن نوێ وەك یەك بن بەهۆی فەرمانی Set Current ←Alignment مەساری یەكەم هەلبژێرە ...یەكسەر درێژیەكەت پێدەلێت, ئینجا مەساری دووەم هەلبژێرە بەهەمان شێوە.

Horizontal Speed Table

Current File: c:\...\aashto-m06.sup Select...

Design Speed: 40

| Degree of Curve | Radius | Rate of Superelevation | 2 Lane Spiral Spi Len | 4 Lane Spiral Spi Len |
|---|---|---|---|---|
| 0^00'000" | 140.000 | 4.500 | 23.000 | 35.000 |
| 0^00'000" | 130.000 | 4.600 | 24.000 | 36.000 |
| 0^00'000" | 120.000 | 4.800 | 25.000 | 37.000 |
| 0^00'000" | 110.000 | 5.000 | 26.000 | 39.000 |
| 0^00'000" | 100.000 | 5.200 | 27.000 | 40.000 |
| 0^00'000" | 90.000 | 5.400 | 28.000 | 42.000 |
| 0^00'000" | 80.000 | 5.600 | 29.000 | 43.000 |
| 0^00'000" | 70.000 | 5.800 | 30.000 | 45.000 |
| 0^00'000" | 60.000 | 6.000 | 31.000 | 46.000 |

Add Delete Edit Save Save As

OK Cancel Help

## چۆن دیزاینی مەساری افقی دەكرێت بەپێی خێرایی دیاریكراو وەبەكارهێنانی ڕێنمایی كۆدەكانی AASHTO .

برۆ بۆ فەرمانی Menu Pale ← Projects هەلبژێرە Survey 2004 دوایی Load

> لە فەرمانی Speed Tables ← Lines/curves ← Create curves

تانگینتی یەكەم دوایی تانگینتی دووەم هەلبژێرە.

پەنجەرەیەکت بۆ دەکرێتەوە Select داگرەو كۆدی تایبەت بە شاری خۆت بەكاربهێنە aashto-m04.sup ئینجا خێرایی دیزاین دیاری بکە بۆ کیرڤەکە بۆ نمونە ئەگەر ٤٠ کم لە هەر کاتژمێرێك بێت.
نیوە تیرەی کیرڤەکە هەلبژێرە بۆ نموونە ٦٠ ئینجا OK دوایی دوو لەین Two Lanes هەلبژێرە ...بەم شێوەیە جیٚبەجیٚی دەكات لەسەر هەردوو تانگێنتەکان.

## چۆن وێنەی مەسارێك دەکرێت بەهۆی PI ؟

پاش دانانی PI بۆ رەسم کردنی مەسارەکە لە فەرمانی By Point # Rang → Line /curve ...ئینجا ژمارەی یەکەم PI دەنوسین دوایی هێمای (–) ئینجا ژمارەی دوا PI دوایی Enter بکەو بەم شێوەیە مەسارێکت بۆ وێنە دەکات لەشێوەی هێلێك Line ئینجا دەبێت پێناسەی بکەیت بەهۆی Define Object → Alignment چونکە هەرشتێك لە ئۆتۆکاد رەسم بکرێت کە دەیهێنیتە لاند پێویستە پێناسە بکرێت.




## چۆن دەتوانێت Widening بکرێت لە لاند؟

فەرمانی Create Offset لە لیستی Alignment بەكاربهێنە بۆ ئۆفسێت کردن بەپانی چیێ قیرتاوکردن با (٣,٥)م بێت لەهەرلایەکەوە, ئینجا بەهۆی فەرمانی ئۆتۆکاد Radius Dimension نیوە تیرەی هەر مەسارێك دەستنیشان دەکەین.
دوایی بەهۆی نیوە تیرە بەفەرمانەکانی ئۆتۆکاد Offset دەکەین نرخی ئۆفسێت بۆ هەر کیرڤێك بنووسە لە تەیبلی مواسەفات, بێگومان ئۆفسێت بۆ ژوورەوە دەبێت.
ئینجا بەهۆی فەرمانی Lines/Curve → Create spiral→ Fit Tangent – Curve پارچە راستەهێلەکە هەلبژێرە ئینجا کێرڤەکە, بەمەش سپایرلەکێرڤ دروست دەبێت.
هەنگاوەکانی سەرەوە دوبارە دەکرێتەوە بۆ هەموو کێرڤەکان...
بازنە دروست بووەکان رەش بکەوەو فەرمانی Trim بەكاربهێنە بۆ برینەکان.
مەسارەکە بگۆرە بۆ Polyline بەهۆی لیستی Modify II لە ئۆتۆکاد.
ئینجا فەرمانی Edit Polyline بەكاربهێنە ...سەرتای مەسارەکە هەلبژێرە ئینجا Y دوایی J بۆ پێکەوەلکاندن ئینجا هەموو مەسارەکە تحدید بکەو Enter بکە ....سەیرکە کە کامە شوێن بەیەکەوە نەلکاون پێکیان بنووسێنە بەهۆی Trim ئینجا دوبارە بەکارهێنانی Edit Polyline ...هتد, تا مەسارەکەت بۆ دروست دەبێت, دوایی دەیتەقێنیتەوە بەهۆی فەرمانی Explode ئینجا پێناسەی دەکەینەوە بەهۆی فەرمانی Define from Object دوایی ناوی بنیٚ ئەگەر Right هەمان هەنگاو دەکەینەوە بۆ مەساری Left.

## چەند تیٚبینیەك:

- دەتوانرێت چەندین مەسار پێناسە بکرێت لە پرۆژەیەك هەر مەسارەو پرۆفایل و کرۆس سێکشنی خۆی دەبێت.
- دەتوانرێت زیاتر لە مەسارێك پێناسە بکرێت و ئینجا بەیەکەوە بلکێنرێن ... بەمەش یەکێکیان دەبێتە مەساری سەرەکی ئەوانی تری لاوەکی دەبن.

- بەرنامەکە دەتوانێت بۆ هەر مەسارێکی سەرەکی هەشت (٨) مەساری تر لە لای راست و هەشتی تر بۆ لای چەپی دروست بکات.
- دەتوانرێت زیاتر لە یەك Connection بکرێت لەهەمان مەسار.
- دەتوانرێت پرێنتی زانیاریەکان بکرێت بۆ هەر مەسارێك کە تەریب بێت لەگەب مەساری سەرەکی بەهەمان ستەیشن دەبێت.

## فەرمانەکانی تری لیستی Alignment بەم شێوەیە:

Set Current Alignment بۆ پێناسەکردنی مەساری (الفعال) کاتی بونی چەند مەسارێك یان کاتی کردنەوەی بەرنامەکە لە نوێوە.

Alignment ← Display current alignment command بۆ پێشاندانی مەساری (الفعال)

List define بۆ دەرهێنانی لیستێك تایبەت بە زانیاری دەربارەی مەسارەکانی پرۆژەکە.

Multiple alignment بۆ دەستکاری کردن و رەشکردنەوەو استیرادکردنی مەسارەکان.

Modify properties بۆ دەستکاری کردنی خاسیەتی مەساری (الفعال) وەکو گۆرینی رەنگ و وەصف و لایەرەکەی.

Merge database بۆ دەمج کردنی داتابەیس بە رەسمی ئۆتۆکادەوە.

Save as adb بۆ خەزنکردنی مەسارەکە بە ئیکستێنشن لە داتابەیسەوە.

Close database بۆ داخستنی داتابەیس

Alignment ← stakeout alignment ← Section بۆ ترتیب کردنی چۆنیەتی دەرهێنان.

Output setting بۆ ئامادەکردنی وەرەقەی دەرهێنان.

Create File بۆ دروستکردنی فایلی دەرهێنان دەستنیشانی فەرمانی Alignment دەکەین.

Defined Object Alignment بۆ پێناسەکردنی مەسارێك کەبریتی بێت لە کۆمەلێك هێلێك بەیەکەوە لکابن بە پارچە پارچەیی نەوەك وەکو Polyline هێلێکی راست یەك پارچەبێت.

